# زانا و
# ستەمكار

**شانۆگەرییەكی مێژوویە**

**باس لە شەهید بوونی سەعیدی كوڕی جوبەیر دەكات**

**لەسەر دەستی حەججاجی كوڕی یوسفی سەقەفی**


نوسینی : **يوسف القرضاوى**

وەرگێڕانی : **إحسان برهان الدين**

# پێشەکی وەرگێڕ

سوپاس و ستایش بۆ خوای پەروەردگار و ،درودو سڵاو لەسەر گیانی پاکی موحەممەد و یارو یاوەران و شوێن کەوتوانی بەگشتی تا ڕۆژی دوایی :

ئەم شانۆگەرییە بەسەر هاتێکی مێژوویی ڕاستەقینەیە ،زۆر پەندو وانەی بەسوودی تیایە ،بەڵام ئێمە بە کورتی جەخت دەکەینە سەر دوو لەو وانانە و، تیشکیان دەخەینە سەر :

١- زانایان ڕۆڵی مەزن دەبینن لە ژیانی خەڵکیدا و ،بریتین لە مەشخەڵی ڕێگا بۆ موسڵمانان ،بۆیە هەڵوێستی ئەوان دەبێتە خاڵێکی وەرچەرخان لە مێژوودا ،هەر لەم ڕوانگەوە ئەوان بەر پرسیاریەتی مەزنیان ڕوو بەڕوو دەبێتەوە ،چونکە ڕۆڵی پێشەنگ دەبینن بۆ موسڵمانان ،سەعیدی کوڕی جوبەیریش یەکێکە لەو زانا ناودارانەی کە لە ڕووی ستەمکار ڕاوەستاو ،پێی وت : تۆ هەڵیت و ستەمکاریت ،نرخی ئەو هەڵوێستەیشی بریتی بوو لە ژیانی ،بەڵام کوژرانی لە سەر دەستی ئەو ستەمکارە لە ڕاستیدا نەمری بۆ دەستەبەر کرد و ،بوو بەمایەی ڕێز لێگرتن لە لایەن موسڵمانانەوە بە درێژایی هەموو مێژووی ئیسلامی ،ئەم ڕووداوە هەزارو سێ سەد ساڵ لەمەو پێش ڕوویداوە و ،تا ئێستایش ڕۆڵی کاریگەر دەبینێت لە بواری بیرو باوەڕو پەروەردە .

٢- ستەمکاران لە هەموو شوێن و سەردەمێکدا چارەنوسی ڕەش چاوەڕوانیان دەکات و ،دەرئەنجامی کردەوە خراپەکانیان ڕوو بەڕوویان دەبێتەوە و ،هەر لە دونیادا لە هەمان ئەو پەرداخە دەخۆن کە دەرخواردی خەڵکیان دەدا ،ئەوەشی چاوەڕوانیانە لە ڕۆژی قیامەت خراپترو سەختترە لەلای خوای گەورە ، (حەجاج)یش ئەگەر چی لە نێو هەندێ لە مێژوو نوسەکاندا هەندێ جیاوازی هەیە سەبارەت بە هەڵسەنگاندنی سەعیدی

كوڕی جوبەیر و ،هێرش كردنی بۆ سەر مەككە ،كە لە ئاكامدابەشێك لە كەعبە ڕووخاو ،عەبدوڵڵای كوڕی زوبەیر كوژرا ،ئەوەندە بەسە بۆ پۆلێنكردنی لە ڕیزی گەورە تاوانبارو ستەمكارانی مێژوو ئەم بەسەر هاتە ،بە شێوەیەكی هونەری جوان كراوە بە شانۆگەرییەك لە لایەن مامۆستا .. یوسف القرضاوی ،منیش لە زمانی عەرەبییەوە وەرمگێڕاوەتە سەر زمانی كوردی ،بەهیوای ئەوەی ئەو خوێنەرە كوردانەی نەیانتوانیوە ئەم بەسەرهاتە لە سەرچاوەكە بخوێننەوە ،لێرە لێی بەهرەمەندبن و ،داواكارم لە هەموو خوشك و برایەك ئەم بەرهەمە دەخوێننەوە لە نزاو پاڕانەوەی چاكەیان بێبەشم نەكەن.

سوپاسی هەركەسێكیش دەكەم ڕەخنەو تێبینیەكی هەبێت ئاراستەم بكات لەسەر ناونیشانی بەریدی ئەلكترۆنی : ihsanburhan@yahoo.co.uk

احسان برهان الدين

كلار

٢٠٠٩/٩/١١

## زاناو ستەمكار

## بەشی یەكەم ( پێكهاتووە لە یەك دیمەن )

**كـــــــــات** : ســەردەمی بــەنی ئومەییــە یــە لــە حــوكمڕانی عەبدولمەلیكی كوڕی مەڕوان و فەرمانڕەوایی حەججاج لەسەر عێراق .

**شـــــوێـــــن** : شاری ( واسط ) لە عێراق ،كە حەججاج لەنێوان كووفەو بەسرەدا دروستی كردبوو .

**كەسەكـــــان** : حـەججاج بـە ئەوپـەڕی لـە خۆبـایی بوونـەوە ،چـوار كەسـیش لـە دەسـت و پێوەندەكـەی بـە دەوریـدان و ،چـەند پاسـەوانێكی چەكدار.

**یەكێك لە دەستو پێوەندەكان** : پیرۆزت بێت ئەی فەرمانڕەوای مەزن ،سەركەوتنت بەسەر دوژمنانی ( أمیر المؤمنین )و دوژمنانی خۆت .

**دووەم** : عێراق هـەمووی باسـی پشتیوانی خـوای گـەورە دەكـەن بۆ خەلیفە لەسـەر دەسـتی ئێـوەو ،شكسـتی ابن ( الاشعث )ی گومڕاكـەری گومڕابـوو وە شوێنكەوتووە شەرمەزارەكانی .

**سێیەم** : ئەوانە فریویان خـوارد بە لێبـوردەیی و نـەرمی و بـەزەیی جـەنابتان لەگەڵ موسڵماناندا ،بۆیە ملهوڕیان كردو شۆڕش و یـاخی بوونی چـەكداریان ڕاگەیاند ،بەڵام بۆیان دەركەوت خۆیان كێن و حججاج كێیە.

**حەججاج** : ( بە لەخۆبایی بوونێكەوە ) ( ابن الاشعث ) وایزانـی ئەگـەر زانایـان بچـنە پـاڵی وەكـو ( سـعیدی كـوڕی جوبـەیر ) دەتوانێـت جەنگەكـە بباتـەوە ، ئەفسـانەیە ،شمشـێری حـەججاج ناشـكێت ،سـەربازەكانی نـەوەی مـەروانیش نابەزێنرێن ،هەواڵی ڕاستەقینەیش لەلای ( دیر الجماجم )ە.

**چـوارەم** : قوربـان ،هەنـدێك لەوانـەی ئامـادەی شـەڕەكەبوون بۆیـان گێڕامـەوە شمشێرەكانت چییان بە ( ابن الاشعث )و شوێنكەوتوانی كردووەو ،سەریان چۆن دەپەڕی و لاشەیان پارچە پارچە دەبوو ،كاتێك دڵنیا بوون لـە شكستی خۆیان ،یان خۆیاندا بەدەستەوە یان هەڵهاتن.

**حەججاج** : ئەوانە پەنديان وەرنـەگرت لـە وەی بەسـەر ( ابـن الـزبير )و كەسانی تر هات لەسەر دەستی حـەججاج ،چارەنووسیشـیان ئـەوەبوو كـە دیتـان !! بـا بەخەیاڵە خاوەكانیان تا دەتوانن ئاگری ئاژاوە هەڵگیرسێنن ، من بـۆ ئـەوان ، من بۆ ئەوان ! !

**سێیەم** : ( جارێكی تر ) بەڵام قوربان نەكەیت بەزەییت بێتەوە بـەو دیلانـەی كە دڵیان پڕە لـە كینـە لـە ئێـوەو بـەنی ئومەییـە و ،بـە ناچاری خۆیـان داوەتـە دەسـتەوە لـە جەنگەكـە ،هـەروەها ئـەو زانایانـە لەبیرمەكـە كـە پشـتگیری ( ابن الاشعث )یـان كـردووەو نـەك هـەر بەقسـە بـەڵكو بەشمشـێرەكانیان ،بەتایبـەت سەعیدی كوڕی جوبەیر .

**حەججاج** : ئێمە چاوەڕوانی نوسراوی ( أمير المؤمنين )ین ،دەربارەیـان ،بـەڵكو ئەمرۆبگات.

**یەكەم** : ( امير المؤمنين ) فەرمانی هـەر بـە كوشـتنيان دەبێـت ،بەرانبـەر بـە تاوانـەكانیان ، هەركسـێكیش شمشـێری سـتەم هەڵكێشـێ هـەر بـەو شمشـێرە دەكوژرێت.

**دووەم** : ڕاستە ،دەست پێشخەریش ستەمكارترە.

**پاسەوان** : بەریدی ئەمیرولموئمنین گەیشت.

**حەججاج** : ئەوە بوو كە چاوەڕوانی بووین ،نوسراوەكەم بۆ بهێنە.

( حەجحاج نامەکە دەکاتەوەو بە دەنگێکی بیستراو دەیخوێنێتەوە )
" سلاوی خوا لە تۆو هاوکارانت بێت ،لە دوای ئەوەش : هەرکیٚ بەشداری کردووە لە ئاژاوەی ( ابن الاشعث )دا لە جەنگی ( دیر الجماجم ) ڕووبە ڕووی شمشێری بکەرەوە ، هەرکامیان دانی نا بە بێباوەڕی و کافر بوونی خۆیدانا ئازادی بکە ، هەرکێیش بەوە ڕازی نەبوو و ،بانگەشەی ئەوەی کرد کە ئیمانداره بده لە گەردنی ، والسلام "

**حەجحاج** : ( بە پاسەوانەکە ) سەرۆکی پۆلیسم بۆ بانگ بکە ( پاسەوانەکە دەردەچێت بانگی دەکات و دێتەژوورەوە ).

**سەرۆکی پۆلیس** : گوێڕایەڵم بۆ فەرمانت گەورەم.

**حەجحاج** : بڕۆ بۆ بەندیخانەو، تۆمتبارەکانم بۆ ئامادەبکە ،پاش ئەوەی نوسراوی ( أمير المؤمنين ) یان بەسەردا دەخوێنیتەوە.

**سەرۆکی پۆلیس** : فەرمانت بەجێیە گەورەم

( دەردەچێت و ،لەپاش ساتێکی کەم پاسەوانەکە دێتە ژوورەوە )

**پاسەوان** : پیرەمێردێك لە دەرگایە ، دەڵێت پێویستی بە جەنابتانە .

**حەجحاج** : بیگێڕنەوە ... ئەمە ڕۆژی پێویستی و نیازداران نییە ...

**پاسەوان** : پاسەوانەکان تێیان خوڕی ، ئەویش گریاو هاواری کرد ،**دەڵێت** : یان بمکوژن ، یان ڕێگەم بدەن بچمە لای حەجحاج ، ئەو پیرێکی پشت چەماوەی ڕیش سپی یە.

**حەجحاج** : کەواتە بابێتە ژوورەوە .

( پیاوێکی بە سالاچووی شکۆدارو ڕیش سپی دێتە ژوورەوە )

**پیرەمێرد** : سلاوی خوا لە فەرمانڕەوا بێت.

**حەججاج :** سلاوی خوا لە تۆیش . پێویستیت چی یە؟

**پیرەمێرد :** بۆ ساڵێك زیاتر دەچێت كوڕكەمتان دەستگیركردووە ، نە ئەوەیە ئازادی بكەن ، نە ئەوەشە لێكۆڵینەوە لە مەسەلەكەیدا بكەن ، دایكێكی بەساڵاچوویشی هەیە فرمێسكی وشك نابێتەوە بە بۆنەی ئەوەوە ، هەروەها خوشكێكی بێوەژنی هەیە دایكی سێ هەتیوە ، كوڕكەیشم تاقە بەخێو كەرێكە بۆ ئەم خێزانە ، لە پاش خوای گەورەش پشتمان بە ئەو بەستووە .

**حەججاج :** ( بەئارامی ) ئەی مامە پیرە ، زیندانی یەكان زۆرن ، هەریەكەو تاوانی خۆیشیان هەیە.

**پیرەمێرد :** كوڕەكەی من هیچ تاوانێكی نەكردووە ،بەلاَم یەكێك لە بەرپرسەكانی تۆ تۆمەتی داوەتە پاڵ پیاوێك لە هۆزەكەمان ، جا كە ئەوی دەست نەكەوت ، كوڕەكەی منی لە جێگای ئەو برد.

**حەججاج :** ئەوە ڕوو دەدا ، كەسی گەڕو گول جاری واهەیە نەخۆشیەكەی دەگوێزرێتەوە بۆ كەسی ساغ ، جا ئەگەر دەتەوێت كوڕەكەت ڕزگاربكەی ئەو هەڵهاتووە ئامادەبكە ، ئایا نەتبیستووە شاعیرەكە چی دەڵێت :

ولرب مأخوذ بذنب عشيرة          ونجا المقارف صاحب الذنب

واتە كەسێك لە هۆزێكدا لەسەر تاوانێك دەستگیر دەكرێت تاوانبارەكەش ڕزگاری دەبێت .

**پیرەمێرد :** ( بەتوندی ) بەلاَم من گوێم لێ بووە خوای گەورە شتێكی تری وتووە!

**حەججاج :** چی وتووە ؟

**پیرەمێرد :** خوای گەورە لەسەر زمانی یوسف فەرموویەتی :

( معاذ الله أن نأخذ الا من وجدنا متاعنا عنده انـا اذا لظـالمون ) ئیتر نـازانم بـاوەڕ بـە خوا بكەین، یان بە شاعیرەكە ؟؟

**حەجاج** : قسەت بۆ نەهێشتمەوە ئەی پیرەمێرد كوڕەكەی ئازاد بكەن.

**یـەكێك لـە دەسـت و پێوەنـدەكانی** : ئەوەیـە دادگـەری !! بـا بـژێت فەرمان ڕەوای دادگەر .

**دووەم** : فەرمانڕەوامان ملكەچ دەبێت بەرانبەر فەرموودەكانی خوای گەورە.

**كەسێكی تر** : فەرمانڕەوامان بە ئەندازەی گەردیلەیەك ستەم ناكات.

( پیاوە پیرەكە دەردەچێت ... پاش ساتێكی كەم پاسەوانەكە دێتە ژوورەوە.)

**پاسەوان** : سەرۆكی پۆلیس تاوانبارەكانی ئامادەكرد.

**حەجاج** : یەك بەدوای یەك بیانكە ژوورەوە .

( پیاوێـك دێتـە ژوورەوە ،سـیمای سوارچـاكی پێـوە دیـارە ، حـەججاج بـە توڕەیی و قینەوە تەماشای دەكات ).

**حەجاج** : دیسان تۆ ؟؟ لـە هـەموو ئاژاوەیەكدا دەتبینین! دوێنـێ لـە ئاژاوەی عەبدوڵڵای كوڕی زوبـەیردا بـووی ، ئـەمڕۆیش لەگـەڵ ( ابـن الاشـعث )دای ، ئەگەر ئاژاوەیەك لە وڵاتی واق واق هەڵگیرسێ تۆ یـەكێك دەبیـت لـە سـەرانی. چیت دوورییـەوە ئـەی مونـافیق لـەو كارانـەت جگـە لـە سەرشـۆڕی شكسـتو شوورەیی ؟!

**پیاوەكە** : ( بە خۆڕاگری و بە خۆنازینـەوە ) سوێند بـەخوا هـەركێ لەسـەر ڕێگـەی ڕاسـت بێـت هـەرگیز سەرشـۆڕ نابێـت ،بـا دونیـاش هـەمووی لـە دژی بوەستێت ،ئەو كەسەیش ڕێگـای چـەوت و نـاڕەوا بگرێـت ، هـەرگیز سـەربەرز نابێت ، ئەگەر مانگ لە نێو چاوانیەوە بدرەوشێتەوە!

**حەجاج :** ( بەهەڕەشەوە ) خوا بمکوژێت ئەگەر نەتکوژم!

**پیاوەکە :** بەلاَم بەرپرسەکەت دڵنیای کردمەوە ، لەسەر بەڵێن و پەیمانی خوا.

**حەجاج :** ئایا تۆ پەیمانی خوات پاراست تاکو ئێمە پەیمانت بپارێزین ؟

**پیاوەکە :** ئایا ناپاکیم لەگەڵدا دەکەیت و ، پەیمانی خوای گەورە دەشکێنی ئەی حەجاج ؟

**حەجاج :** ( وەکو هەڵهاتن لە وەلاَمدانەوە ) پێم بڵێ : ئەم جارەیان بۆچی لە دژمان وەستای ؟

**پیاوەکە :** ( بە خۆنازین و هێزەوە ) ئەوەی کە پێشتر لەڕووتان ڕایوەستاندم و ،لە داهاتوویشدا بەهەمان شێوە . ئێوە دەتانەوێت موڵکایەتی بێت و قەپی پیابکەن ، ئێمەیش دەمانەوێت خیلافەت و ڕاوێژبێت ، ئێوە دەتانەوێت وەکو موڵکی کیسراو قەیسەر بێت ،ئێمەیش دەمانەوێت بەپێی قورئان و سوننەت بێت.

**حەجاج :** ( وەکو گاڵتەپێکردن ) ئایا تۆ ئیسلامامان فێردەکەیت و ،ئێمە سەرمان تیاسپی کرد ؟

**پیاوەکە :** ئایا کەس هەیە نەزانێت خوێن ڕشتن و ماڵ زەوتکردن و تۆقاندنی موسڵمانان ، تاوانێکی گەورەیە ئیسلام پێی ڕازی نابێت ؟

**حەجاج :** ئێمە تەنها سزاو تەمێی هاوشێوەکانی تۆ دەکەین لە ستەم کارو خراپەکاران.

**پیاوەکە** : گریمان ستەم کارم ،ئایا تۆ ڕەچاوی شەرعی خوات کرد لە مامەڵەکردن لەگەڵ ستەمکاراندا ؟ ئەوانە نابێت شوێنی هەڵاتوویان بکەویت ، یان دیلیان بکوژیت ،یان بچیتە سەر برینداریان و ،ماڵیان بەتاڵان ببەیت.

**حەجاج** : ئێوە ستەم کارنین ،بەڵکو بە هەڵوەشاندنەوەتان بۆ بەیعەتەکەتان و ،یاخی بوونتان لە ( أمير المؤمنين )لە ئیسلام دەرچوون.

**پیاوەکە** : سەرپێچی ئێمە بەرانبەر ستەمو زۆرداریيە ، دوای ئەوەی توانای ئارامگرتنمان نەما ، ( ابن الاشعث )یش بەتەنها خۆی دەرنەچوو ،بەڵکو گەلی عێراقی لەگەڵ دەرچوو ،زانایانیش ڕابەرییان دەکرد ،ئایا ئەو زاناو شەرع ناسانە کافرو مونافیقن ؟ تەنها تۆو سەربازەکانت ئەی حەجاج موسڵمان و ئیماندارو خواناسن ؟

**حەجاج** : ( بەتوڕەییەوە ) ئایا تەشقەڵەم پێدەکەیت ئەی گەندەڵ ؟ دەبێت فریای پێشەوا گومڕاکەت بخەم ، بیبەن لە گردنی بدەن. بۆئەوەی بزانێت کاممان کوژراو سەرشۆڕین ؟ من یان تۆ ؟!

**پیاوەکە** : من وادەزانم بە کوژراوی نامریت ئەی حەجاج .

**حەجاج** : بۆچی ئەی نوقڵانە لێدەر ؟

**پیاوەکە** : چونکە گوێم لە پیاو چاکان بووە وەکو حەسەنی بەسری و ، سەعیدی کوڕی جوبەیر دەپاڕانەوە لە خوای گەورە بە کوژراوی نەمرێت ، بەڵکو لەسەر جێگای خۆت بمریت .

**حەجاج** : ( بەخۆشحاڵیەوە ) حەسەن و سعید داوا لە خوا دەکەن لەسەر جێگای خۆم بمرم؟!

**پیاوەکە** : بەڵێ ئەی حەجاج ،بۆئەوەی خوای گەورە هەموو سزاکەت بخاتە ڕۆژی دوایی ،ئەوەیش توندترو ئابڕو بەرترە.

**حەجاج** : ( بەتوڕەیی و هەڵچوونەوە ) ئەو مەلعونە بکوژن ،بیبەنەلای جەللاد.

**یەکێک لە دەست و پێوەندەکانی** : شایستەی کوشتنی بوو.

**دووەم** : ئەوە کەمترین سزایە بۆ ئەو جۆرە کەسانە .

**کەسێکی تر** : پاداشتی خراپەیش خراپەیەکە وەکو خۆیەتی .

" کابرایەکی بەسالاً چووی تەمیمی لە تۆمەتبارەکان ،لەگەڵ لاوێکی تر لە هۆزی بەنی بکر دەچنە ژوورەوە "

**حەجاج** : " بەلاوەکە دەڵێت " ئیمانداری یان بێ ئیمان ئەی لاو ؟

**لاوەکە** : حەز دەکەیت کافربم یان ئیمان دار ؟

**حەجاج** : ( بەتوندو تیژی )کاتی وتووێژ نییە . کافری یان ئیماندار؟

**لاوەکە** : بەڵکو من کافرم .

**حەجاج** : ( بەفێڵەوە ) بەلاًم بەسالاً چووی تەمیمی بە کافری ڕازی نابێت !

**پیاوەپیرەکە** : دەتەوێت فریوم بدەیت ئەی حەجاج ، بەخوا ئەگەر شتێك لە کوفر خراپتر بووایە پێی ڕازی دەبووم لە پێناوی ئەوەی لە شمشێرەکەت قوتاربم.

( ئیتر حەجاج پێکەنی و ئازادی کرد )

(ئینجا پیاوێکی تری بۆ دەهێنن)

**حەجاج** : لەسەر ئایینی کێیت تۆ ؟

**پیاوەکـە** : لەسەر ئاینی ئیبراهیم بە پاك و پاراوی و ، هەرگیز ئیبراهیم توخنی بتپەرستی نەدەکەوت.

**حەجاج** : لە گەردنی ئەو درۆزنە بدەن.

( پیاوێکی تری بۆ دەهێنن )

**حەجاج** : لەسەر ئایینی کێی تۆ ؟

**پیاوەکە** : لەسەر ئاینی شێخ یوسفی باوکت !

**حـەجاج** : سوێند بەخوا باوکم زۆر خەریکی ڕۆژوو و، شەو نوێژبوو.ئەی خولام وازی لێبهێنە.

( خولامەکە کۆتی پێی پیاوەکە دەکاتەوە وە ئەویش دەچێتە لای حەجاجەوە ).

**پیاوەکـە** : ئەی حەجاج ،پرسیارت لە هاوەڵەکەم کرد : لەسەر ئایینی کێیت ؟ وتی : لەسەر ئایینی ئیبراهیمو فەرمانت کرد بە کوشتنی ،هەمان پرسیاریشت لەمن کردو ، وتم لەسەر ئایینی شێخ یوسفی باوکتم و ، باسی خواپەرستی باوکت کردو فەرمانت کرد بە ئازاد کردنم .

**حەجاج** : ( سەری دەلەقێنێتەوە ) بەڵێ بەڵێ .

**پیاوەکـە** : سوێند بەخوا ئەی حەجاج ، ئەگەر باوکت هیچ خراپەی نەبوایە جگە لەوەی کەسی وەکو تۆی هێناوەتە دونیاوە ،بەسی بوو ئەوەندە خراپی .

( دەستو پێوەندەکان بەسەر سوڕمانەوە تەماشای یەکتر دەکەن و چپە لەگەڵ یەکتر دەکەن )

**حەجاج :** ( بەهەڵچوون و توورەیی یەوە ) بیكوژن . ئەو ناڵەباره بكوژن لە گەردنی بدەن.

( ئینجا گەنجێك دێتە ژوورەوە بە ڕواڵەت پیاو چاكی پێوە دیارە ناوی ((ثابت))ە )

**یەكێ لە دەست و پێوەندەكان :** ( بە چپە بە حەججاج دەڵێت ) ئەوە لە قوتابی یەكانی سەعیدی كوڕی جوبەیرە !!

**حەجاج :** تۆ لە قوتابییەكانی سەعیدی كوڕی جوبەیری سەرلێشێواوی گومڕاكەری ؟!

( ثابت ) : نەخێر .

**حەجاج :** ئایا نكۆڵی دەكەیت لە پەیوەندیت بە ئەو ؟

( ثابت ) : ئەوەی تۆ باست كرد من نایناسم ،بەڵام ئەوەی من دەیناسم پیاو چاك و چاكخوازەو زاناو موجاهیدە ،كە سەعیدی كوڕی جوبەیرە !

**حەجاج :** یاخی بوو لە خیلافەت ، هەوڵدەر بۆ ئاژاوە گێڕی ،كەی پیاو چاك و چاكخوازە ئەی نەفامی مونافیق ؟

( ثابت ) : هەركێ لە ئایینی خوا دەربچێت ،جێی خۆیەتی خەڵكی هەڵسن لە دژی ، لە ڕاستیدا ئاژاوە گێڕیش بریتییە لە ئازاردانی زانایان و پیاو چاكان بە ناهەق ، ئایا فەرموودەی خوای گەورەت نەخوێندووەتەوە ئەی حەججاج :

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ فَتَنُواْ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ ثُمَّ لَمْ يَتُوبُواْ فَلَهُمْ عَذَابُ جَهَنَّمَ وَلَهُمْ عَذَابُ ٱلْحَرِيقِ ﴾ البروج: ١٠

**حەجاج :** ئەوە زانستەكەی سەعیدی كوڕی جوبەیرە ؟

( ثابت ) : بەڵكو ئەوە فەرموودەی خواو پێغەمبەرە.

**حەجاج** : سوێند بەو كەسەی كە سوێندی پێدەخۆی ،دەبێت درووێنەتان بكەم یەك بەدوای یەك تاكو لەنێوتان دەبەم .

( **ثابت** ) : تۆ دەدووریتەوەو ،خواش دەچێنیّ ،جا تەماشاكە دەر ئەنجام چۆن دەبێت ؟

**حەجاج** : ئەم لاف لێدەری زانستە بكوژن ( ئینجا ڕووی تێدەكات و بە گاڵتەوە پێی دەڵێت ) بەڵكو مامۆستا خواناسەكەت ئەمڕۆ فریاتكەوێت ؟!

( **ثابت** ) : سوودو زیان بەدەست خوای گەورەیە " ألا لە الخلق والامر " بۆ ڕۆژێكی ئاوها خۆمانمان ئامادە دەكرد ،كڕین و فرۆشتنەكە لەسەر دەستی تۆ بەدیهات ئەی حەجاج !

**حەجاج** : كڕین و فرۆشتنی چی ئەی نەفامی لاف لێدەری زانایی ؟

( **ثابت** ) : اعوذ بالله من الشيطان الرجيم " ان الله اشترى من المؤمنين انفسهم و اموالهم بان لهم الجنة " ئەمەیش ڕۆژی ئەوەیە كەل و پەلەكە بدەین و نرخەكەی وەرگرین : بەهەشت ئەی حەجاج " ومن اوفي بعهده من الله ؟! "

**حەجاج** : تەنها دۆزەخ چاوەڕوانت دەكات . بەپەلە بیبەن و لە گەردنی بدەن.

( **ثابت** ) : " فاقض ما انت قاض . انها تقضي هذه الحياة الدنيا "

( ثابت دەبەن بۆلای جەللادەكە ).

**حەجاج** : كێی تر ماوە لەو یاخی بووانە ؟؟

**سەرۆكی پۆلیس** : عامیری شەعبی و ،موتەڕڕیفی كوڕی عەبدوڵلاّ ، بەلاّم سەعیدی كوڕی جوبەیر هەڵهاتووە و خۆی شاردووەتەوە وەكو دەزانیت .

**حەجاج** : ئایا بە هەموو توانایەكتانەوە نەتانتوانی دەستگیری بكەن ؟

**سەرۆكی پۆلیس** : خوا پایەدارت بكات ،ولاَتی خیلافەت بەرفراوانە ،كەسێكیش بیەوێت دەتوانێت هەڵبێت بۆ ماوەیەكی دیاری كراو ،بەلاَم سەر ئەنجام هەردەبێت دەستگیر بكرێت .

**حەججاج** : ئەو دووانە با لە زینداندا بمێننەوە تاكو سێیەمیان دەدۆزینەوە ،هەرگیز سەعید لە چنگم قوتاری نابێت . منم حەججاج . منم كوڕی یوسف!!

## بـــــــــەشـــــــــی دووەم

## دیمـــــەنی یـــــەكـــــــــەم

( سەعیدی كوڕی جوبەیر خۆی شاردووەتەوە لەماڵی یەكێك لە قوتابی یەكانیدا لە مككە ،ئەوانیش لە دەوری دانیشتوون لە بازنەیەكی زانستی دا )

<u>سـەعـیـد</u> : بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبان ،سوپاس و ستایشی خوای گەورە دەكەین و ،درودو سلاو دەنێرین بۆ سەر گیانی پاكی موحەممەد و یارو یاوەران و شوێنكەوتوانی .

لە پاش ئەویش ،موعازی كوڕی جەبەل ڕەزای خوای لێ بێت دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەر (ﷺ) كە فەرموویەتی : دوو پێی هیچ بەندەیەك ناترازێت لە ڕۆژی قیامەتدا تاكو دەربارەی چوار شت پرسیاری لێنەكرێت : دەربارەی تەمەنی و، لە چیدا بەسەری برد ؟ هەروەها لاوێتی و ، لەچیدا گوزەراندی ؟ هەروەها ماڵەكەی و ، لە كوێوە دەستی كەوتووەو لە چیدا خەرجی كرد ؟ هەروەها زانستەكەی و ، چی كارێكی پێكرد ؟

ئەم فەرموودە ڕۆڵەكانم بەرپرسیارێتی یەكی هەرەگەورە دەخاتە سەر هەڵگرانی زانست ، چونكە سبەی پرسیاریان لێدەكات سەبارەت بەو زانستەی هەیان بوو چی كردەوەیەكیان پێكرد ،هەروەها پرسیار لە هەموو كەسێكی خاوەن هۆش دەكرێت دەربارەی نیعمەتەكانی خوای گەورە لەسەری: نیعمەتی ژیان وە گەنجی و ، ماڵ و سامان و ،لە كۆتایشدا نیعمەتی زانست ، كە خوای گەورە مرۆڤی پێ جیا كردووەتەوە لە ئاژەڵ ،زانست ڕۆڵە شیرینەكانم نیعمەتێكی مەزنە خوای گەورە دەیبەخشێتە هەركەسێك بیەوێت لە بەندەكانی ،سوپاسی ئەو نیعمەتەش بە كارپێكردنی دەبێت فێركردنی بۆ خەڵكی ،بۆیە هەركێ زانستێكی هەبێت و كاری پێبكات ، ئەو كەسە زانای

ڕاست گۆیە لەگەڵ پەروەردگاری خۆی ،هەرکەسیش زانستێکی هەبێت و لە خەڵکی بشارێتەوە لە کاتێکدا ئەوان پێویستیان پێی بێت ،لەڕۆژی قیامەتدا بە لەغاوی ئاگرین لەغاو دەکرێت ،هەرکەسیش زانستی هەبێت و کردەوەی پێ نەکات ،وەکو گوێ درێژێك وایە ،بارێك کتێبی بەسەر پشتەوەبێت ،بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) بەزۆری ترسی لە سەر ئوممەتەکەی پاش خۆی لە مونافیقێکی قسەزان بوو .

**یەکێکیان :** ( بەسەرسوڕمانەوە ) مونافیقی قسەزان ؟ چۆن دەگونجێ کەسێك مونافیق بێت و زانستیشی هەبێت لەهەمانکاتدا ؟

**سەعید :** زانایە بە زمانی ،بەڵام دڵی خاڵی یە لە ترسی خوای گەورە ،لە عەلی کوڕی ئەبو تالیبەوە ڕەزای خوای لێبێت ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : " من ترسم نییە لەسەرتان لە ئیماندار یان لەکەسێك هاوبەشی بۆ خوا پەیدا بکات ،چونکە ئیماندار ئیمانەکەی دەبێتە بەربەست لە پێشیدا ، موشریکیش شیرکەکەی سەرکوتی دەکات ،بەڵام ترسم لەسەرتان لە مونافیقێکی قسەزانە ،قسەیەك دەکات ئێوە دەیزانن و ،کردەوەیەك دەکات ئێوە نکۆڵی لێدەکەن " ئازیزەکانم ئەوە کەسێکە مێشکی پڕە لە زانست وە دڵی بەتاڵە لە ترسی خوای گەورە

**قوتابی :** نیشانەی ترسی خوا چی یە؟

**سەعید :** نیشانەی ئەوەیە ببێتە ڕێگر لەنێوان تۆو تاواندا .

**قوتابی :** چی یە یارمەتی کەسێك بدات بۆ ئەوەی لە خوا بترسێت ؟

**سەعید :** یادی مەرگ و ڕۆژی دوایی ، ئەوەیە ژەنگ و پیسی دڵ لادەبات و ،هەڵخەڵەتانی مرۆڤ بە دونیا کەم دەکاتەوە ،ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) دوو ئامۆژگاری لەنێوانماندا بەجێهێشتووە ، یەکێکیان قسەدەکات و ، ئەوی

تر بێ دەنگە . ئەوەی قسەدەکات قورئانە ، بێ دەنگەکەیش مردنە ،لە راستیدا من ئەگەر یادی مردن نەکەمەوە دەترسم دڵم بگۆڕێت .

قوتابی یەکی تر : ئایا ئەو واتایە ئەوە دەگەیەنێت کە کەسی ئیماندار ڕقی لە ژیان بێت یان بە سوك تەماشای بکات .

سەعید : نەخێر کوڕم ،بەڵکو هەموو ڕۆژێك ئیماندار بەسەری دەبات دەسکەوتە ،خوای خۆی تیا دەپەرستێت ، یان سوود بەخەڵکی دەگەیەنێت ، یان خۆی پاك دەکاتەوە ،چونکە دونیا کێڵگەی دواڕۆژە ، ئەمڕۆ تۆوێی تیا دەچێنێ بۆ ئەوەی سبەی بیدورێتەوە .

( ئینجا بەقسەکانی ڕوو دەکاتە هەمووان )

ڕۆڵەکانم ! ئەم دونیا باڵە مێشوولەیەك ناهێنێ بەلای خوای گەورەوە .ئەوەندش بێ بایەخە بەلای خواوە ، سەرپێچی کردنی فەرمانەکانی تەنها لە دونیادا دەبێت ،ئینجا دوژمنانی خواش تیایدا خۆشگوزەرانی دەکەن و ،ستەم دەکەن ،خۆشەویستانی ستەمیان لێدەکرێت و ،دەربەدەر دەکرێن ،ئامان دونیا سەرقاڵتان نەکات لە دوا ڕۆژ ،خوای گەورە دونیا دەداتە هەرکێ خۆشی بوێت و خۆشی نەوێت ،بەلاَم ئایین دەداتە ئەوانەی کە خۆشی دەوێن، ئایینیش بە بێ زانست ،زانستیش نییە بەبێ کردەوە ،کردەوەش نییە بەبێ دڵسۆزی ،منیش دەپاڕێمەوە لە پەروەردگارم ئێوە بکاتە پاشەکەوت بۆمن و ، بتان پارێزێت و چاودێریتان بکات و ، بتانگێڕێ بەو کەسانەی کە زانستیان هەیە و ،کردەوەدەکەن ،کردەوەش دەکەن بە دڵسۆزییەوە ،دڵسۆزیشیان لێ وەردەگرێت .

قوتابی یەکی تر : ئەی باوکی عەبدوڵلاَ دەڵێی خوا حافیزیمان لێ دەکەیت بەم قسانە !

**سەعید** : بەڵێ سوێند بە خوا وایە ، كێ دەزانێ ! لەوانەیە ئەم چاوپێكەوتنەمان دواجار بێت ،بمبینن لەم دونیا بێ بایەخەدا .

**قوتابی یەكی تر** : خوای گەورە تەمەن درێژت بكات بۆمان بۆئەوەی ڕێگەمان بۆ ڕووناك بكەیتەوە.

**سەعید** : ئێوە دەزانن ئەو پیاوە سیخوڕو سەربازەكانی بە هەموو لایەكدا بڵاو كردووەتەوە بە دوامدا دەگەڕێن ،واش دەزانم پێم دەگەن ،واش نازانم بەبێ كوژران لە دەستی دەربچم.

**قوتابی یەكی تر** : ( بەداخ و پەژارەوە ) خۆمان و ماڵمان دەكەینە قوربانت .

**سەعید** : مردن سەرئەنجامی هەموو زیندوویەكە ،ئەوەشی بەشمشێر نەمرێت بەشتێكی تر دەمرێت ،تامی مردنیش لە شتێكی پڕوپوچدا ، وەكو تامی مردنە لە مەسەلەیەكی هەرە مەزندا ،تەنها قسەی پیاو چاكان دووپات دەكەمەوە "ربنا افرغ علینا صبراً و توفنا مسلمین " لێشتان ناشارمەوە ،خۆم و دوو ڕەفیقم جارێك پێكەوە دانیشتین و هەستمان بەخۆشی پاڕانەوە كرد ، هەردوو ڕەفیقەكەم خوای گەورە نزاكەی لێ قبوڵ كردن و ،گەیشتنە ئاواتی خۆیان ،بەڵام من هەر چاوەڕوانی دەكەم.

**قوتابی یەكی تر** : باشە چۆن بێدەنگ بین بەرانبەر ئەم ستەمكارە سەركەشە؟

**سەعید** : كوڕم ! خوای گەورە مەحاڵە فەرمانی خۆی بەجێ نەهێنێت ، ئێمەش كۆمەڵی زانایان هەڵساین لە دژی ئەو پیاوە و ،خۆمان خستە ڕیزی (ابن الاشعث )ەوە ،لە جەنگەكەیدا ،وازمان لە كتێب هێناو ،كەتیبەمان

ئامادەكرد ،وازمان لە پێنوس هێناو ،شمشێرمان هەڵگرت ،مەرەكەبی زانایانیشمان گۆڕی بە خوێنی شەهیدان .. ئێمە شتێكمان ویست و ،خوای گەورە شتێكی تری ویست ،وەكو تاقیكردنەوەیەك بۆ ئیمان و خۆڕاگریمان ، ئیتر ئەوەی كوژرا كوژراو ،ئەوەی گیرا گیراو ،ئەوانی تریش هەڵهاتن.

**قوتابی** : ئایا پەیڕەوانی ڕێگای ڕاست هیچیان لەسەرە ئەگەر شكست بخۆن بەرانبەر ستەمی ستەمكاران؟

**سەعید** : نەخێر هیچ گوناهێكیان لەسەر نییە ،گوناه لەوەدایە ئەگەر بێ دەنگ بین بەرانبەر خراپە ، یان یارمەتیدەر بین بۆ ستەمكاران ،بەڵام ئەگەر هەوڵ و كۆششمان كرد ،ئێمە ئەوەمان بەدەستە و ،دەرئەنجامەكان لەلای خوایە ،خوای گەورە پرسیارمان لێناكات بۆچی سەر نەكەوتین؟ بەڵكو پرسیارمان لێ دەكات بۆچی كارتان نەكرد؟

**عومەیری قوتابی** : بەڵام ! ئایا ئەم شەوە تاریكە كۆتایی نایەت ؟ چۆن دەبێت هەق باڵ شكاو بێت ؟ بانگخوازەكانی بكوژرێن و ،پەیڕەوان و لایەنگرانی ئەشكەنجە بدرێن ؟! ئەمە لەكاتێكدا ستەم كاران و پەیڕەوانی ڕێگای ناهەق بە خۆیان دەنازن و ژمارەو كەرەستەی زۆریان هەیە ،خوێن دەڕێژن و تالأنی دەكەن وە كەسیش توانای بەرەنگار بوونەوەی نییە ؟ ئایا ئێمە لەسەر ڕاست نین و ،ئەوان لەسەر ڕێبازی ناڕەواو پوچەڵن ؟

**سەعید** : لەباری دایكت بچوایەیت ئەی عومەیر ،ئایا تۆ بە گومانی لەوە ؟ سوێند بەخوا ئەگەر پارچە پارچەمان بكەن تاكو مەلەوەرەكان بمان خۆن و ،گۆشتەكانمان دابەش ببێتە ناو سكی دڕەندەكان هیچ كاتێك گومان نابەین لەوەی كە لەسەر هەق و ڕێگای ڕاستین و ئەوانیش لەسەر ناڕەوایی و هەڵەن .

**عومەیر :** ئەی كەواتە بۆچی ئەوان هەر سەردەكەون و سەردەكەون ،ئێمەیش هەر شكست دەخۆین و شكست دەخۆین .

**سەعید :** بەڵات لێ كەوێت ، ئەوكاتە شكست دەخۆین كە گومان لە بانگەوازی خۆمان بكەین ،یان بە پڕو پوچی ئەوان هەڵخەڵەتێین ،خاوەنی هەقی بێ چەك ئەگەر خۆڕاگربێت بەرانبەر ناهەقی پڕچەك ئەوە سەركەوتنە ،سەركەوتووە با لەدیدی كورت بیناكەنەوە بە بەزیو تەماشا بكرێت ،نموونەیە كتان بۆ بهێنمەوە ؟

بەرزترین نموونە لە مێژووی ئێمە بێگومان پێغەمبەرمانە (ﷺ) لە ڕۆژی كۆچكردندا ،لەو ڕۆژەی دەركرا لە ماڵی خۆی و لە شاری خۆی بە ستەم لێكراوی و ڕاونراوی ،خۆی دەشاردەوە لە ناو ئەشكەوتێكی تاریكدا ،ئایا ئێوە ئەو هەڵوێستە بەچی دادەنێن ؟ ئایا شكست خواردوو بوو یان سەركەوتوو بوو ؟

( قوتابییەكان بێدەنگن وەڵامیان پێنیە )

**سەعید :** چیتانە بۆ بێدەنگ بوون ؟

**یەكێك لە قوتابیكان :** چی خاوەن ئیمانێك دەتوانێت پێغەمبەری خوا بە شكست خواردوو باس بكات ،كە خوای گەورە پشتگیری كردووە بە سەركەوتنی خۆی ؟

**سەعید :** بەڵام من ئەو ڕۆژە بە ڕۆژێكی سەركەوتن و شكۆداری دەژمێرم لە ئیسلامدا ،ئەی بۆچی بیرو باوەڕم وانەبێت لە كاتێكدا خوای گەورە لە قورئاندا وای فەرمووە : " إلا تنصروه فقد نصرة الله ،إذا اخرجه الذين كفروا ثاني اثنين إذا هما في الغار ،إذ يقول لصاحبه لاتحزن إن الله معنا " كەواتە خوای گەورە سەری خست لەو ڕۆژەدا ،لە ڕۆژی ئەشكەوتدا ،كێ دەتوانێت

شكست بداتە پاڵ پێغەمبەر (ﷺ) ،كە خوای گەورە خۆی سەری خستووە . عومەر ڕەزای خوای لێبێت بە دووربینی خۆی دەركی كرد بەم واتا گەورەیە لە ڕۆژی كۆچكردندا ،بۆیە كردی بە سەرەتای مێژووی ئیسلام ،نەگونجاویشە مێژووی موسڵمانان بە ڕۆژێك دەست پێ بكات ئیسلام تیایدا شكستی هێنابێت .

**عومەیر** : لێم ببورە مامۆستا ،لەوانەیە تووڕەم كردبێتی بەو قسەیەم. پەلە كردن سروشتی مرۆڤە ،منیش هەرچەندە دەردە سەری و ئەشكەنجەو نەهامەتی دەبینم دادەبەزێتە گۆڕەپانی ئیمانداران و بانگخوازان بۆلای خوای گەورە ،بێ ئارام دەبم و ،سنگم تەنگ دەبێت ،بەتایبەت كاتێك دەبینم بانگخوازانی ناهەق لە خۆشی و ساغ و سەلامەتیدان ،وادەزانن سەرزەوی موڵكی خۆیانە .

**سەعید** : لەسەر خۆبە كوڕم ،دەردە سەری و ئازار پێویستە بۆ هەڵگرانی پەیام و میراتگرانی پێغەمبەر (ﷺ) ، بۆئەوەی خوای گەورە تاقییان بكاتەوەو دڵەكانیان خاوێن كاتەوە ،ئەوەیش دەیبینی لە خۆش گوزەرانی و ،ساغ و سەلامەتی ،ئەوە تاقیكردنەوە و ،بەڵگە چەسپاندنە لەسەریان بۆئەوەی پاساویان بۆ نەمێنێتەوەو ،خوای گەورە لە ناكاو لەناویان بدات " فلما نسوا ما ذكروا به فتحنا عليهم ابواب كل شئ حتى إذا فرحوا بما اوتوا اخذنا هم بغتة فاذا هم ملبسون فقطع دابر القوم الذين ظلموا والحمدالله رب العالمين " سونەتی خوای گەورەیش كوڕی خۆم ،دەستاو دەستكردنی ڕۆژگارە لە نێوان خەڵكیدا ،ڕۆژێك بۆتوو ڕۆژێك لە دژت ،بەلآم گرنگ سەرئەنجامە سەرئەنجامیش بۆ خواناسانە .

ئایا تێگەیشتی ئەی عومەیر دڵت ئاسوودە بوو ؟ یان هێشتاهەر گومانت ماوە ؟ ئەگەر وایە ،پێویستە جارێکی تر قورئان بخوێنیتەوە ،دڵ و هۆشتی بۆ بکەیتەوە ،بۆئەوەی بزانیت چۆن خوای گەورە بەندەکانی تاقی دەکاتەوە ،ئایا سەرەتای سوورەتی ( العنکبوت )ە.

خوێندووەتەوە : " ألم أحسب الناس أن يتركوا أن يقولوا أمنا وهم ولا يفتنون " ئایا لە سورەتی ( الفرقان )دا فەرموودەی خوای گەورەت نەخوێندووەتەوە " وجعلنا بعضكم لبعض فتنة أتصبرون "! هەروەها " ذلك ولو يشاء الله لانتصر منهم ولكم ليبلو بعضكم لبعض " لە هەمان سورەتیشدا دەفەرموێت " و لنبلونكم حتى نعلم الجن بل هدين منكم والصابرين و نبلوا أخباركم " سوێند بەخوا ئەوەندە بەلا بەسەر هاوەڵانمدا هات و ،من هەر لە ساغ و سەلامەتیدام تاکو خۆمم لەبەر چاو کەوت و ،گومانم بۆ دروست بوو کە خوای گەورە هیچ پێویستیەکی بە من نییە تاکو بەڵام بەسەردا دابەزێنێ ،بەڵام ئێستا هیوام تازە بوویەوە فریای هاوەڵانم بکەوم ،بەڵکو پشکێکم دەست کەوێت لەوەی دەستی بانگخوازان دەکەوێت بۆلای خوای گەورە .

**<u>عومەیر</u>** : خوا پاداشتی چاکەت بداتەوە وەکو یەکێك لە ڕێ پیشاندەرانی ڕێگای ڕاستی ،سوێند بەخوا دەردەسەریت لەلا خۆشەویست کردم.

**<u>سەعید</u>** : ئیماندار داوای ساغ و سەلامەتی لە خوا دەکات و ،هەرگیز خۆزگە ناخوازێ بە بەڵاو چەرمە سەری ،بەڵام ئەگەر داشبەزی بەسەریدا خۆڕاگر دەبێت .

( لە پڕ یەکێك لە پاسەوانەکان خۆی دەکاتە ئەو ژوورەی کە سەعید و قوتابیەکانی تیا دانیشتوون)

**پاسـەوان :** جێگـای خۆتـان بەرمـەدەن ،هـەواڵم زانیـوە کـە سـەعیدی کـوڕی جوبەیرتان تیایە ،کامەتان ئەوە ؟

**قوتابیەکان :** ( بەیەك دەنگ ) من .

**پاسەوان :** سەیرە هەمووتان سەعیدی کوڕی جوبەیرن ،

**قوتابیەکان :** بەڵێ هەموومان سەعیدی کوڕی جوبەیرین ؟

**پاسەوان :** سەعید یەك کەسە یان دە کەس ؟ سەعید یەکێکە لە ناوتانـدا ،لـە کـورتی بیبڕنـەوەو پـێم نیشـان بـدەن ،ئەگـەر نـا فـەرمان ڕەواتـان لـێ ئاگـادار دەکەمەوە و ،هەمووتان سزا دەدرێن .

**یەکێکیان :** من سەعیدی کوڕی جوبەیرم .

**یەکێکی تر :** باوەڕی پێ مەکە .. من سەعیدم .

**سێ یەم :** باوەڕ بەو دووانە مەکە ،سوێند بەخوا من سەعیدم .

**پاسەوان :** سوێند دەخۆیت کە تۆ سەعیدی ؟!

**سـەعـیـد :** باوەڕیـان پـێ مەکـە کـوڕم ،مـن سـەعیدم و ئەوانـەش قوتـابی منن ،ئایا وادەزانی سەعیدی کوڕی جوبەیر لاوە ؟ سەعید لـە تەمـەنی پـەنجاو حەوت ساڵیدایە و ،ئەوانەیش کە دەیانبینی لاون .

**پاسەوان :** ڕاست دەکەیت ،چۆن ئەوەم لێ ڕەتبوو ؟

( ئینجا ڕوو دەکاتە ئەوەیان کە سوێندی خوارد ). چۆن سوێندت خـوارد بـە خوا کە تۆ سەعیدی ،تۆ قوتابی زانستی و درۆ دەکەیت ؟!

**قوتـابی :** بـە درۆ سـوێندم نـەخواردووە و ،لـە ڕاسـتی لام نـەداوە . **وتم :** سـوێند بـەخوا مـن سـەعیدم ،ئـەوەش ڕاسـتە ،چـونکە مـن بەختـەوەرم ــــ

ئەوپەڕی بەختەوەری ــ ئەگەر خۆم بکەم بە قوربانی زانای ئیسلام سەعیدی کوڕی جوبەیر .

**پاسەوان :** من هەرگیز فیداکاریم نەبینیوە لەچەشنی ئەوەی ئەمڕۆ بینیم ،نەفرەتی خوا لە حەججاج بێت ،دەمانکاتە ئامڕازی ئازاردانی موسڵمانان و ئەشکەنجە دانی زانایان ،ڕسوابێت ئەو پیشە خراپەی من دەیکەم .. ( ئینجا ڕوودەکاتە سەعید ودەڵێت )..

ئەی مامۆستا ،سوێند بەخوا من وازت لێدەهێنم ،هیوا دارم کاتێك دەچمە لای خوای خۆم دەستم پاراو بێت لە تاوانی دەستگیر کردنت ! ئێوەش ئەی ڕۆڵەکانی مامۆستا ،سوێندتان دەدەم بە خوای گەورە بەکەس مەڵێن من ئێوەم بینیوە یان ئێوە منتان بینیوە ،چونکە حەججاجی ستەمکار ئەگەر ئەوە بزانێت جگە لە سەربڕینم سزایەکی ترم نادات ... بەخوا ئەگەر لە پێناو منداڵە وردەکانم نەبوایە کە بەخێو کەریانم لەم کارەم نەدەمامەوە بۆ ماوەی یەك ڕۆژ ،خوایە داوای لێخۆشبوونت لێ دەکەم .

( پاسەوانەکە دوو هەنگاو ڕێدەکات و ،دەگەڕێتەوەو ،دەڵێت ): باشتر وایە مامۆستا ئەم جێگایە بەجێ بهێڵێ بۆ ماڵێکی دوور لە جێگایەکی تر ،بەڵکو خوای گەورە چاوی ستەمکارانی لێ کوێر بکات .

**یەکێک لە قوتابییەکان :** سوپاس بۆ خوا ،چاکە لەم ئوممەتەدا هەر دەمێنێتەوە تا ڕۆژی قیامەت ،کێ گومانی دەبرد ئەو پاسەوانە دڵێکی ئاوها میهرەبانی هەبێت ؟!

( پاسەوانەکە دەردەچێت و ،سەعید ئاوڕ دەداتەوە لە قوتابییەکانی )

**سەعید :** بەم کردەوەتان شەرمەزارتان کردم کوڕە خۆشەویستەکانم ، سوێند بەخوا نازانم چۆن سوپاستان بکەم ،داواکارم خوای گەورە خۆی

پاداشتتان بداتەوە . ڕۆڵەكانم ئەوانەی لە پێناو دونیادا كۆدەبنەوە ،لە پێناو هەمان مەبەستدا سبەی لە یكتر جیادەبنەوە ،بەڵام ئەو پەیوەندییەی كە هەرگیز ناپچڕێت ،پەیوەندی ئاینیە و ،پەیوەندی لە خوا ترسانە ،بۆیە پەرۆش بن بۆ مانەوەی ئەو پەیوەندییە لە پێناو خوای باڵادەستدا ،ئایا فەرموودەی خوای گەورەتان نەخوێندووەتەوە : " الاخلاء يومئذ بعضهم لبعض عدو إلا المتقين "

بەخوای گەورەتان ئەسپێرم ئازیزەكانم

( پـــــــــەردە )

## دیـــــمـــــەنـــــــی دووەم

( سەعید لە ماڵێكی دووردایە لە ئاوەدانی لـە دەوروبـەری مەككە ،برادەرێكی دەچێتە لای كە ناوی ( أبو حصین )ە. )

**أبو حصین** : ئەی باوكی عبدوڵلاّ ئایا دەزانیت فەرمانڕەوای تازەی مەككە ، چی بە خەڵكی وت لە مزگەوتەكەدا ؟

**سـەعـیـد** : وتی چی ؟

**أبـو حصـین** : سـوێند بـەو كەسـەی كـە سـوێندی پێـدەخۆین و حـەجی بـۆ دەكـەین ،لـە هـەركوێ سـەعید ببیـنم دەیكـوژم و خانووەكـەی بەسـەردا دەڕوخێنم، سێ ڕۆژیش مۆڵـەتتان دەدەم ،ئاگادار یـش كراومەتـەوە پیاوێك ئەم جێگایەی تۆی پێ نیشان داون ،بێگومان دەنێرێت بەدواتدا ،جا بـە گوێم بكەو لێرە مەمێنە .

**سـەعـیـد** : ئەی (**أبو حصین**) ،بە خوا ئەوەندە هەڵهاتم و خۆم شاردەوە ،تاكو شەرمەزار بووم لـەلای خـوای خـۆم ،بۆیـە وازم لێبێنـە لێـرە تـاكو خـوای گەورە فەرمانی خۆی جێبەجێ دەكا.

**أبو حصین** : سوێند بە خوا بەختەوەر دەتبینم وەكو چۆن دایكت ناوتی ناوە سەعید ،بەخوای گەورەت دەسپێرم .

**سـەعـیـد** : بەخوای گەورەت دەسپێرم كە سپێردراوەكانی نافەوتێن .

(أبو حصین) دەردەچێت و ،پاش كـەمێك كەسێك لـە دەرگـا دەدا و ،پیاوێك لەلایەن فەرمانڕەواوە دێتە ژوورەوە كەو هاتووە بۆ دەسگیركردنی )

**پیاوەکە** : فەرمانڕەوا بەم جێگایەتی زانیوەو ،منی ناردووە کە ئامادەت بکەم لەلای ،منیش پەنا دەگرمە خوا لەو کارە ،بۆیە بۆهەر جێگایەك دەتەوێت بڕۆ ،منیش لەگەڵتدام.

**سەعید** : ئەوەندە هەڵهاتم و خۆم حەشاردا تاکو شەرمم کرد لە پەروەردگارم ،ئەوەیشی خوای گەورە نوسیبێتی هەر ڕوودەدات.

**پیاوەکە** : ئێمە هەڵدێین لە قەدەری خوا بۆ قەدری خوا ،منیش ترسم لە تۆ نییە ئەوەندەی ترسم لەم ئوممەتە هەیە ،کە خەشم و قینی خوای بەسەردا دابەزێت چونکە زاناکانی دەکوژێت . بۆیە بەقسەم بکەو با پێکەوە دەربچین ،وەکو چۆن موسا لەفیرعەون هەڵهات " وقال رب نجني من القوم الظالمين "

**سەعید** : ( ئەم قسە کاری تێکرد ) ئایا منالّ و کەسو کارت لێرە هەیە؟

**پیاوەکە** : بەڵێ.

**سەعید** : کەواتە دەیان بەن و توشی هەمان ئەو ئەشکەنجە دەبن کە من توشی دەبم .

**پیاوەکە** : من دەیاندەمە دەستی خوای گەورە .

**سەعید** : نەبەخوا ،هرگیز نابمە هۆکار بۆ ئازاردانی هیچ موسڵمانێك ،ئەوی فەرمانت پێکراوە بەجێی بهێنە ،خوای گەورەش بە نیەتی چاکت پاداشتت دەداتەوە .

**پیاوەکە** : والی مەککە دەتنێرێتە لای حەججاج ،تۆش دەزانیت ئەو چەند بە زەبرو زەنگە .

**سەعید** : ویستی خوا بابێتە دی ،تۆ هیچت لەسەر نییە.

**پیاوەکە** : من ڕازی بووم ببمە ڕەوانە کراوی والی بۆ لای تۆ ،بەمەبەستی ئەوەی بتگەیەنمە جێگایەکی بێ ترس ،ئیتر چۆن دڵم ڕێگەم بدات کۆت بخەمە دەستت و بتدەم بەدەستی کەسێکەوە کە میهرەبانی لە دڵیدا نییە ؟؟ (( چاکەم لەگەڵ بکەو ،با لەم جێگایە دەربچین ))

**سەعید** : کەس و کارت بەبۆنەی منەو ئەشکەنجە دەدرێن ،منیش هەرگیز ئەو کارەم پێناکرێت ،باهرچیشم بەسەردا بێت ،ئەوەی فەرمانت پێکراوە جێبەجێی بکە ،ئەوە دەستمە کۆتی بکە.

**پیاوەکە** : ( فرمێسك بە چاوەکانیدا دێتە خوارو ، دێتە پێشەوەو ،هەردوو دەستی سەعید دەبەستێتەوەو ،دەڵێت ) : ئەوەی کە خوای گەورە بڕیاری دابێت کەس نایگرێتەوە ،خوایە تۆ دەزانیت من حەزم بەم کارە نەدەکرد.
(إنا لله و إنا إلله راجعون )

( پـــــــــەردە )

## بـــــەشـــــی ســـــــێیـــــەم

### دیمەنی یەکەم

( زیندانێکە لە بەندیخانەیەکدا سێ لە زانایانی لە خۆ گرتووە : عامیری شەعبی و ،موتەڕڕیفی کوڕی عەبدوڵڵا و ،سەعیدی کوڕی جوبەیر )

**شەعبی** : چیت پێیە ئەم بەیانییە ئەی موتەڕڕیف ؟

**موتەڕڕیف** : خەونێك دڵی خۆشکردم و ،بەوە لێکمدایەوە کە لەم زیندانە دڵتەنگە دەردەچم .

**سەعید** : (وەکو ناڕازی) لە زیندان دەرچوون هەمیشە هەر چاك نییە ،بەڵکو چاکە لە جێگیر بوونە لەسەر ڕێگای ڕاست ،یوسف سەلامی خوای لێبێت ،سەرپشك کرا لە نێوان خراپەکاری و ،لە نیوان زیندانـدا ،ئەویش فەرمووی : " رب السجن احب الي مما يدعونني اليه "

**شەعبی** : بەڵام مەسەلەکە هەر زیندانی نییەو بەس ئەی باوکی عبدوڵڵا ، بەڵکو کوشتن و سەربڕینە!

**سەعید** : " ولئن قتلتم في سبيل الله أو متم لمغفرة من لله ورحمة خير في يجمعون".

**موتەڕڕیف** : ئایا دەتەوێت گەردنی خۆت بدەی بەدەستی ئەو ستم کارانە ،کە ئەوان نەترسی خوایان هەیەو ،نەبەزەییان بە خەڵکیدا دێتەوە ؟!

**سەعید** : (ئاماژە دەکات بۆ سەری خۆی ) چی تیایە ئەگەر ئەمە لە لاشەم جیا ببێتەوە لە پێناو خوادا ! ( بەتوندی و نکۆڵی کردن ) ئایا لەبیرتان چوو ئەوانە چییان لە ئێوە دەوێت ؟ دەیانەوێت دان بەوەدا بنێن کە ئێوە لە ئایین هەڵگەڕاونەتەوە ،ئایا بەخۆتان دەڵێن کافر ؟

**شەعبی** : ئەی باوكی عەبدوڵڵا " إلا أن تتقوا منهم تقاة "

**سەعید** : ئەی موتەڕڕیف ،تۆیش بەنیازی دان بەوەدا بنەی كە كافری؟

**موتەڕڕیف** : ئەی باوكی عبدوڵڵا ،بە شێوەیەكی ناڕاستەوخۆ هەندێ قسە دەكەم و ،درۆیش ناكەم ،بەڵام بەبێ ئەوەی بە ڕاشكاوی قسەیەك بكەم ڕازی دەكەم ،ئەی تۆیش بۆ واناكەیت و گەردنت ڕزگار بكەیت .

**سەعید** : گەردنی من چییە بەرانبەر گەردنی پێغەمبەران و پیاو چاكان و شەهیدان ؟ ئایا پێغەمبەر زەكەریا بە مشار نەكرا بە دوو لەتەوە ؟ ئایا سەرگەورەمان یەحیا سەرنەبڕدرا ،ئایا خۆتان نەتانگێڕاوەتەوە لە پێغەمبەر (ﷺ) كە فەرموویەتی ( چاكترین جیهاد قسەیەكی ڕاستە لە لای فەرمانڕەوایەكی زۆردار ). ئایا عومەرو عوسمان و علی و حوسین ڕەزای خوایان لێبێت بە ستەم نەكوژران ؟

**شەعبی** : بەڵێ .. منیش قسەی هەقم كرد ،بەڵكو شەڕیشم كرد لە پێناویدا .. بەڵام خوای گەورە شتێكی تری ویست ،بۆیە پێویستە ئارام بگرین و ، خۆمان ئامادە بكەین بۆ هەلێكی تر .

**سەعید** : من لەسەر هەڵوێستی هەق دەژیم و لەسەری دەمرم ،بەرەنگاری زەبرو زەنگی ستەمكارانیش دەبمەوە ،خوای گەورەیش بەتوانایە لەسەر جێبەجێكردنی فەرمانی خۆی .

**موتەڕڕیف** : گریمان ئەمڕۆ قسەی هەقت كرد بەڕاشكاوی ،بەو تەنها جارە زەبرو زەنگی ستەمكاران بنەبڕدەبێت .

**شەعبی** : نەخێر ، سەعیدی کوڕی جوبەیر دەکوژرێت ،ئەو زانا شەرع ناسەو ،حەجاجیش دەمێنێتەوە ،ئەو ستەمکارە سەرکەشە ،دەوڵەتی ستەمیش وەکو خۆی دەمێنێتەوە .

**سەعید** : ( بەتوڕەییەوە ) ئەوە چیە لێتانی دەبیستم ،ئایا دەگونجێ پیاوی وەکو ئێوە قسەی وابکات ؟ کەی پەرۆشی لەسەر ژیان ئامانجی پێغەمبەران و ،میراتگرانی پێغەمبەرانە ؟ سوێند بەخوا هەر شەهیدێك دەکەوێت لە پێناو هەقدا زەمین لەژێر پێی ستەمکاراندا دەهەژێنێ ،لەوانەشە ستەم و زەبرو زەنگ بۆ چەند ساتێك بمێنێت ،بەڵام بە لەرزۆکی و نائارامی و بێ ئاسوودەیی دەمێنێتەوە ،درەختی ئیسلامیش تەنها بەخوێن نەبێت ناڕوێت ،هەر ئەو خوێنەش ئاماژە دەکات بۆ ئەوەی ئەم ئومەتە هێشتا چاکەی تیاماوەتەوە و ،کەسانێك هێشتا ماون خۆیان بە ویستی خۆیان بە خوا بفرۆشن .

(( شەعبی و موتەڕریف کاریگەر دەبن بە قسەکانی سەعید ))

**شەعبی** : لێمان ببورە ئەی باوکی عەبدوڵلاً ،مەسەلەکە ئەوەیە ئێمە پەرۆشین بۆ تۆو ،سوود وەرگرتنی ئوممەت لە تۆ ،خەڵکی پێویستیان بە تۆیە ،پێویستیان بە زانست و تێگەیشتنی تۆیە .

**سەعید** : ئەی شەعبی ،وەکو چۆن خەڵکی پێویستیان بە کەسێکە زانستیان فێر بکات ،پێویستیان بە کەسێکە فێری خۆڕاگریان بکات لە سەر ڕێگای ڕاست و ،لە دژی ستەمکاران.

**موتەڕریف** : ئەی سەعید پلەو پایەی ئێمە لە تۆ نزمترە ،وازی لێبهێنە ئەی شەعبی ،سوێند بەخوا دەڵێی تەماشای خوێنی شەهیدی دەکەم بە نێو چاوانیەوە دەگەشێتەوە .

**سـەعـیـد** : " قل لن يصينا إلا ما كتب الله لنا هو مولانا وعلى الله فليتوكل المؤمنون " (وەردیانەکە دەرگاکە دەکاتەوەو ،سێ کەسی لەگەڵدا دێتە ژوورەوە ،دەرگای زیندانەکەیان لێدادەخات ،هەمووان بێدەنگن )

(( یەکێك لە سێ کەسە تازەکە ئەو بێدەنگیە دەشکێنێت و ،لە سێ زانا کە نزیك دەبێتەوە و ،ئەم پرسیارە ئاراستەی موتەڕڕیفی کوڕی عبدوڵلاّ دەکات)).

**پیاوەکە** : وەڵامم بدەرەوە ئەی مامۆستا ،خوای گەورە بتکاتە مایەی سوود.

**موتەڕڕیف** : ئەو دووانە پێشەوایانی کووفەو و شەرعناسانین دەتوانی پرسیاریان لێبکەیت.

**پیاوەکە** : کامەن ؟ ڕەحمەتی خوات لێبێت !!

**موتەڕڕیف** : ئەوەیان سەعیدی کوڕی جوبەیرە و ،ئەوەشیان عامیری شەعبی یە.

**سـەعـیـد** : ئەوەش موتەڕڕیفی کوڕی عبدوڵلاّ یە .

**پیاوەکە** : " لاحول ولا قوة إلا بالله " ،زانایان زیندان دەکرێن و ئەشکەنجە دەدرێن ،خراپەکارو ستەمکارانیش بە ئارەزووی خۆیان دێن و دەڕۆن.

( پیاوەکە ڕوو دەکاتە سەعیدو دەڵێت )

فتوام بۆ بدە ئەی پێشەوا ،سێ بە سێ تەلاقم خواردووە لەسەر هاوسەرەکەم کە حەججاج لە دۆزەخدایە ،ئایا ژنەکەم تەلاقی کەوتووە ؟

**سـەعـیـد** : پرسیار لە شەعبی بکە وەڵامت دەداتەوە .

**پیاوەکە** : ( ڕوو دەکاتە شەعبی و دەڵێت ) چی دەڵێیت ؟

**شەعبی** : ئەگەر حەجاج لە بەهشتدا بێت سەرەڕای هەموو ئەم کردەوانەی ،سوێند بەخوا زیانی نییە .ئەگەر بەحەرام لەگەڵ هاوسەرەکەتدابیت؟!

**پیاوەکە** : دڵت ئاسوودە کردم .

(( کەسێکی تر دێتە پێش و پرسیار دەکات لە شەعبی ))

**پیاوەکەی تر** : وەڵامم بدەرەوە ئەی پێشەوا خوا بتپارێزێت ،ئایا حەجاج کافرە یان ئیماندارە ؟

**شەعبی** : ( بەگاڵتەوە ) حەجاج ئیماندارە .

**پیاوەکەی تر** : ( بەنکوڵیەوە ) حەجاج ستەمکاری زۆردار ،بکوژی موسڵمانان و دوژمنی پیاو چاکان و سوکایەتی پێکەری ئازادان و فیرعەونی عەرەب ،ئیماندارە ؟؟!!

**شەعبی** : بەڵێ ئیماندارە بە تاغوت و ستەم ... بێ باوەڕە بە ئایەتەکانی خوا !

**پیاوەکە** : بەڵێ وایە .

( وەردیانەکە دێتە ژوورەوەو ،دەیانبینێ بێدەنگن )

**وەردیان** : ئەوە چی یە بێدەنگ بوون کە هاتمە ژوورەوە ؟

**سەعید** : ڕەحمەتی خوا لە کەسێك قسەیەکی چاك بکات و چاکەی دەستکەوێت ،یان بێدەنگ بێت و سەلامەت بێت .

**وەردیان** : ئەی مامۆستا ،بە پیاو چاکان دێیتە پێش چاوم ،چی دەڵێی دەربارەی یاریدەدەرانی ستەمکاران ؟

**سەعید** : ئەوانە سەگی ناو دۆزەخن ،لەناو دۆزەخدا دەوەڕن لە وێنەی سەگ .

**وەردیان** : چی دەڵێی دەربارەی من ؟ ئایا من لە یاریدەدەرانی ستەمكارانم ؟

**سەعید** : نەخێر ،یاریدەدەری ستەمكاران وەكو ئەو كەسەیە جلەكەت بۆ دەشوات ،چێشتەكەت بۆ لێدەنێ و ...وو

**وەردیان** : (بە سەرسوڕمانەوە ) ئەی من ؟

**سەعید** : بەلاّم تۆ ؟ تۆ لە خودی ستەمكارانی ،ئایا بەشدارنیت لە ئەشكەنجە دانی خەڵكیدا ؟! خوای گەورە كاتێك لەعنەتی كرد لە فیرعەون و هەمان لەعنەتی كرد لە سەربازەكانیشیان ،خوای گەورە دەفەرموێت : " فا خذناه و جنوده في اليم ،فانظر كيف كان عاقبة الظالمين " هەروەها فەرموویەتی " أن فرعون و هامان و جنود هما كانوا خاطئين ".

**وەردیان** : بەلاّم من توانای ئەوەم نییە بڵێم : نەخێر !!

**سەعید** : ئەگەر نەیانزانیبا بێ ڕەحمی ئەم كارەیان پێ نەدەسپاردی .

**وەردیان** : من ئەگەر ئەو كرێ نەبێت كە وەری دەگرم مناڵەكانم برسی دەبن .

**سەعید** : ڕۆزی خوای گەورە لە هەموو جێگایەكە ،جا ئەگەر حەزدەكەی بەدوای كارێكی تردا بگەڕێ و بەشدار مەبە لە ستەمدا ،هەر كێیش ڕاست بكات لەگەڵ خوای خۆی ،خوای گەورە پشتی بەردنادات " و من يتق الله يجعل له مخرجا و يرزقه من حيث لا يحتسب و من يتوكل على الله حسبه "

**وەردیان** : ( دەست بەرەو ئاسمان بەرز دەكاتەوە )

خوایە تۆ دەزانی من پاسەوانم لای ئەو كاربەدستانەو ،دڵم نەفرینیان لێدەكات ،خوایە پەنات پێدەگرم لەوەی ستەمكاربم ،یان یاریدەدەری ستەمكاربم . خوایە لە ڕابردووم خۆشبەو ،ڕێگای دەرباز بوونیشم بۆ بدۆزەرەوە لە داهاتوودا .

## دیـــــــــەنـــــــی دووەم

( حەججاج لە كۆڕی فەرمانڕەواییدا شانی داداوەتە سەر تەختەكەی لەلای چەپیشـیەوە هەنـدێ لـە دەسـت و پێوەنـدەكانی ڕاوەسـتاون ،سـەرۆكی پاسەوانان دێتە ژوورەوە )

**حەججاج** : سێ تۆمەتبارەكەم بۆ بهێنە ژوورەوە بە دوای یەكتردا .

( موتەڕڕیفی كوڕی عەبدوڵلاَ دەهێننە ژوورەوە )

**حەججاج** : ئاگاداری لە نوسراوی ( أمير المؤمنين ) دەربارەتان ؟

**موتەڕڕیف** : بەڵێ .

**حەججاج** : تۆ كافری یان ئیمانداری ؟

**موتەڕڕیف** :خوای گەورە فەرمان ڕەوامان چاك بكات ،ئەو كەسەی یاخی دەبێت و ،پەیمان دەشكێنێ و ،ناپاكی دەكات لە ئەمانەتدا و ،لە سوونەت جیادەبێتەوە و ،موسڵمانان دەترسێنێ ،شایستەی كافر بوونە .

**حەججاج** : ( ڕوو دەكاتە ئەوانەی دەورووبەری بە دڵخۆشیەوە ).. ئەوە دانی نا بە بێ باوەڕی خۆیدا ،ئازادی بكەن .

**دەست و پێوەندەكان** : ( لەناو خۆیاندا بە چپەوە دەڵێن ).. سوێند بەخوا دەڵێـی مەبەسـتی حەججاجـە ( شـەعبی دێتـە ژوورەوەو ،پاسـەوانەكە دەچپێنێت بە گوێ یەوە )..پێ ی بڵێ من كافرم و خۆت قوتاربكە .

( حەججاج لەوكاتەدا سەری لە خوار بوو ،هەستی بەوە نەكرد )

**حەججاج** : ئەی شەعبی تۆیش لەو كەسانەی كە دژمان وەستای و هەوڵت دا بۆ ئاژاوەگێڕی ؟

**شـــەعبی** : خـوای گـەورە فـەرمانڕەوامان چـاك بكـات ،خـەڵكی هەنـدێ ئامۆژگاريـان كـردم كـە هەنـدێ قسـە بكـەم لـەلات ڕازيـت بكـەم و خـوا لـەخۆم بڕەنجێنم ،منيش واناكەم ،بەڵام من قسەی ڕاستت لەگەڵ دەكەم ،لە ڕاستيدا ئێمە ئاژاوەيەكی كوێرانە خۆی پياكێشاين ،ئێمەش تيايدا نە پياو چاك و لە خـوا تـرس بـووين ،نـە خراپـە كـارێكی بـەهێز بووين ،تـاكو ئـەوە ڕوويـدا كـە بينيت.

**حـەججاج** : ( ڕوو لـە دەسـت و پێوەنـدەكانی دەكـات ) ڕاسـتی كـرد . نـە پيـاو چاكانێكی لە خوا ترس بوون ،كە دەستيان پاراو ڕاگرن لـە جـەنگی ئێمـە ،نـە خراپە كارێكی بەهێزيش بوون بتـوانن بمـان بـەزێنن ،ئـەی شـەعبی بڕۆ لێـت خۆش بووين.

پيری ئاخر شەڕو ،سەری ئاژاوەكەم بۆ بهێنن

( ســـەعـيـد دێتە ژوورەوە )

**حەججاج** : ( خۆی بێئاگا دەكات ) تۆ كێی ؟

**ســـەعـــيـــد** : من سەعيدی كوڕی جوبەيرم .

**حەججاج** : نەخێر تۆ بەد بەختی كوڕی لەناو چووی.

**ســـەعـــيـــد** : دايكم شارەزاتر بوو بە ناوی خۆم و ناوی باوكم.

**حەججاج** : بەد بەخت بيت خۆت و دايكيشت .

**ســـەعـــيـــد** : ئـەو كەسـە بەدبەختـە بچێتە دۆزەخـەوە ،ئايـا تـۆ لـە غـەيب ئاگادار كرايتەوە ؟

**حەججاج** : بۆچی هەموو ئەم ماوە هەڵهاتی و خۆت حەشاردا ؟

**ســـەعـــيـــد** : قسەی موسا دەكەم " ففرت منكم لما خفتكم "

**حەجاج** : ( بەتوندی ) ئایا قسەم پێدەکەی ؟

**سەعید** : بەڵکو باسی ڕاستی دەکەم .

**حەجاج** : تۆ کافری یان ئیمانداری ؟

**سەعید** : ( بەمتمانەوە ) لەو ڕۆژەوەی ئیمانم هێناوە بێباوەڕ نەبوومەتەوە .

**حەجاج** : خۆت بە ئیماندار دەزانی ئەی مونافیق !! سوێند بەخوا دەبێت مەرگت پیٚ پیشان بدەم!

**سەعید** : ( بەمتمانەو ئاسوودەیی ) کەواتە دایکم پێکای کاتێك ناوی نام سەعید ،خۆشحاڵی چی بێت مەزنتر لە شەهیدی لە پێناو خواو ،هاوەڵێتی سەرگەورەی شەهیدان حەمزەی کوڕی عبدولموتەڵیب ؟

**حەجاج** : ( بەسووکایەتی و هەڕەشەکردنەوە ) بە هاوەڵی کەس نابیت جگە لە خەواریج و یاخی بووەکان ،دەبێت دونیات بۆ بگۆڕمەوە بە ئاگرێکی بڵیسە دار.

**سەعید** : ( بەمتمانەوە ) ئەگەر بمزانیایە ئەوەت بەدەستە ،دەمکردی بە خوای خۆم.

**حەجاج** : ( بەتوڕەیی و قینەوە ) بەلاٚت لێکەویٚ ئەی بەد بەخت !!

**سەعید** : بەد بەختی بۆ ئەو کەسەیە کە لە بەهەشت دوور بخرێتەوەو ،بخرێتە دۆزەخەوە .

( حەجاج ڕوو دەکاتە لایەکی تر بە قسەکانی )

**حەجاج** : چی دەڵێیت دەربارەی خەلیفەکان و ،کامیان چاکترە ؟

**سەعید** : ( دەرگای ئەم باسە دادەخات ). من بریکاری ئەوان نیم و ، وە پارێز نیم بەسەریانەوە .

**حەججاج** : کامیان بەلاتەوە خۆشەویست ترن ؟

**سەعید** : کامیان خوای خۆی زیاتر ڕازی کردبێت .

**حەججاج** : باشە کامیان خوای خۆی زیاتر ڕازی کردووە ؟

**سەعید** : زانستی ئەوە لای کەسێکە کە شارەزایە لە قسەی پەنهان و شاراوە .

حەججاج : ناتەوێت ڕاستم لەگەڵدا بکەیت ؟

**سەعید** : بەڵکو نەم ویست درۆت لەگەڵدا بکەم .

**حەججاج** : بۆچوونت چۆنە دەربارەی موعاویە ؟

**سەعید** : کاروباری خۆم سەرقاڵی کردووم لە شوێنکەوتنی کردەوەی پیاوان و حوکم کردنە سەریان.

**حەججاج** : لە وەڵام دانەوە هەڵدێی ؟!

**سەعید** : بەختەوەری بۆ کەسێك کەم و کوڕی خۆی سەرقاڵی بکات لە بەدواداچوونی کەم و کوڕی خەڵکی .

**حەججاج** : چی دەڵێی دەربارەی شەڕی عەلی و موعاویە ؟

**سەعید** : ئەو خوێنانە خوا دەستمانی پاراو کرد لە تێوەگلانی با ئێمەش زمانمانی لێپاراو بکەین.

**حەججاج** : دەربارەی من چی دەڵێی ؟

**سەعید** : خۆت بە خۆت شارەزاتری .

**حەجاج** : بەڵام من دەمەوێ بۆچونی تۆ بزانم .

**سەعید** : کەواتە نارەحەت دەبیت و خۆشحاڵ نابیت .

**حەجاج** : باواش بێت ... حەز دەکەم بزانم .

**سەعید** : وازم لێبهێنە.

**حەجاج** : خوا وازم لێ نەهێنێ ئەگەر وازت لێ بهێنم.

**سەعید** : ئەگەر هەر ئەوەندە سووری لەسەر زانینی ڕای من دەربارەت ، من وادەزانم تۆ کەسێکی لادەری لە قورئان و سونەتی پێغەمبەر (ﷺ) و ڕێبازی خەلیفەکان ،خۆت هەڵدەخەڵەتێنی بە هەندێ کردەوە بۆ پاراستنی شکۆداری خۆت و ،بەهێز کردنی دەسەڵاتت ،ئەوانەش دەبنە هۆی ماڵ وێرانی کردنت و ،سبەیش دەرئەنجام دەبینی و بۆت دەردەکەوێت.

حەجاج : ئایا سوپاکانم ڕەوانە نەکرد بۆ شەڕ کردن لە پێناو خوا ؟ ئایا موحەممەدی کوڕی قاسمی سەقەفیم نەنارد بۆ فەتحی سیند ؟ ئایا ئاسایشم بەر قەرار نەکرد لە عێراق ؟

**سەعید** : بەڵێ ... بەڵام تۆ کەسێکی ستەمکارو بە زەبرو زەنگی ،زیادە ڕەوی دەکەیت لە خوێن ڕشتندا ،پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت : "نەمانی دونیا بەلای خواوە ئاسانترە لەوەی موسڵمانێك بکوژرێت " ،ئەی چۆن بۆ کەسێك کە هەزارانی کوشتووە ؟. تۆ ئەی حەجاج دەتەوێت بەندەکانی خوا بکەیتە بەندەی خۆت ،لە چاکەو خراپەدا گوێڕایەڵت بن ،لە ڕەواو ناڕەوادا هەربڵێن : فەرمانت بەجێیە ... ئایینی ئێمەش گوێڕیەڵی قبوڵ ناکات تەنها لە کاری چاکەدا نەبێت ،گوێڕیەڵیش ڕەوا نییە بۆ هیچ کەسێك ئەگەر ئەو کەسە لە خوای گەورە یاخی بووبێت .

**حـــەججاج :** ( وەکـو پاسـاو هێنانـەوە ) ئایـا دەتـەوێت تـەماعکارەکان و بـۆ هەڵگەڕاوەکان واز لێبهێنین ؟ پێویستە نیوە ڕۆژەیـان پێبکـەین پـێش ئـەوەی بمانکەنە شێوی خۆیان.

**ســـــەعید :** بـەڵام ئـاینی خـوا بـاوەڕی بـەم جـۆرە ژەمانـە نییـە ،کەسـانێك بکـەیت بـە ژەمـی نیـوەڕۆو کەسـانیکیش بـۆ ژەمـی ئێـوارە ! تـۆ ئەگـەر ڕۆژی دواییت بویستایە ئەی حەججاج ،دەسەڵاتت هەڵنەدەبژاردە سەری ،کە ئەگـەر ئەمڕۆش بمێنیتەوە سبەی لادەچیت .

( حەججاج خۆڕاگری پیشان دەداو ،داخی خۆی کپ دەکاتەوە و بە قسەکانی ڕوو دەکاتە لایەکی تر).

**حەججاج :** من لەلای خوا خۆشەویست ترم لەتۆ .

**ســـەعید :** خوا خۆی ئاگادارترە لە پەنهان ،سبەیش هـەموو کـەس ئاکـامی کردەوەکانی خۆی دەبینێتەوە و ،کەسیش ستەمی لیٚ ناکرێت .

**حەججاج :** من لەگەڵ پێشەوای کۆمەڵدام ،تۆیش لەگەڵ پێشـەوای دووبـەرەکی و ئاژاوە گێڕیدای .

**ســـــەعید :** کۆمـەڵ ئەوەیـە لەگـەڵ حەقدا بێـت ،با بەتـەنها خـۆتیش بیـت ، وەکـو ئیبنـو مەسعود دەفـەرموێت " ئـاژاوەگێڕیش ئـازاردانی خـەڵکی یـە لـە ئاینەکەیاندا .

**حەججاج :** ئەوەیە بۆچوونە گومڕاکانت کە فێری قوتابییەکانتی دەکەی ؟

**ســـەعید :** بەڵکو ئەوە زانستی پێغەمبەرە (ﷺ)، هەوەڵانی لێیـان وەرگـرت و ، ئێمەش لە ئەوانمان گێڕاوەتەوە .

**حەججاج :** ئایا نابینی چی کۆدەکەینەوە بۆ ( أمير المؤمنين )؟

**سەعید** : هیچم نەبینی .

**حەجاج** : ئەی خولام ،هەندێ لەو ئاڵتوون و زیوو پۆشاك و خشلانە بهێنە .

( ئەویش هێنای و لەبەردەستی حەجاجدا داینا )

**حەجاج** : ئێستا چی دەڵێ ی ؟

**سەعید** : شتێكی چاكە ئەگەر هەڵسی بە مەرجەكانی .

**حەجاج** : مەرجی چییە ؟

**سەعید** : بە ڕێگای ڕەوا بەدەستی بهێنی و ، لە جێگای گونجاوی خۆیدا داینیێ و ،ئەگەر نا ،یەك هاواری ڕۆژی قیامەت شیردەر لە كۆرپەكەی بێئاگا دەكات و ،باری هەموو باردارێك دەخات .

**حەجاج** : ئایا حەزدەكەی هەندێك لەمانە هی تۆ بوایە ؟

**سەعید** : حەز لە شتێك ناكەم كە خوا حەزی لێنەكات .

**حەجاج** : واز لە هەموو ئەمانە بهێنە ،دەڵێن هەرگیز پێنەكەنیوی نهێنی ئەوە چی یە؟

**سەعید** : لەژیاندا شتێكم نەبینیوە شایەنی پێكەنین بێت !! ئاخر كەی دەگونجێ كەسێك پێبكەنێت و ڕێگاشی بەسەر دۆزەخدا تێپەڕێت ،نازانێت ڕزگاری دەبێت یان دەكەوێتە ناوی " وان منكم إلا واردها كان على ربك حتى مقضياً "

**حەجاج** : دڵەكانمان یەكسان نین ،هەركێ و ئەو كارەی بۆی دروستكراوە بۆی ئاسان دەبێت .

**حەجاج** : ئایا گوێت لە عودو نەی نەبووە ؟!

( نای دەهێنن و لێی دەدەن و ســەعید دەست دەکات بە گریان )

**حەجاج** : بۆچی دەگری ؟ ئەوە گاڵتەو خۆشییە!

**ســـــەعید** : بـەڵکو ئـەوە خـەم و پەژارەیـە ، ئـەو فـوو تێکردنـە ،فـوو پیاکردنێکی مەزنی بە یاد هێنامەوە " يوم ينفخ في الصور فأتون افواجاً" " و نفخ في الصور فاذا هم من الاجداث إلى ربهم ينسلون "

**حەجاج** : ئایا بە قسەی ناسك دەمانخەڵەتێنی بۆ ئەوەی لێت خۆش بم؟

**ســـەعید** : ( بەسەربەرزییەوە ) لێخۆشبوون لەلای خوای گەورەیە ،بەڵام تۆ هیچ لێخۆشبوون و پاساوێکت نییە ئەی حەجاج .

**حەجاج** : ( بە تووڕەییەوە ) هەڵبژێرە بۆ خۆت بە چی شێوازێك حەزدەکەیت بتکوژم؟

**ســـەعید** : ( بە توندی ) بەڵکو تۆ بۆخۆت هەڵبژێرە ئەی حەجاج ،سوێند بەخوا بەهەر شێوازێك بمکوژیت ئاوها دەکوژرێیتەوە لە دواڕۆژدا .

**حـەجاج** : بەخوا دەبێت کوشتنێك بتکوژم کەسم بەو شێوەیە نەکوشتبێت پێش تۆ ،کەسیش لە پاش تۆ ئاوها نەکوژم !!

**ســـەعید** : کەواتە دونیام تێك دەدەیت و ، منیش دواڕۆژت تێکدەدەم .

(خولامەکە شمشێر و کەرەستەی گەردن لەسەر دانان ئامادە دەکات )

**حەجاج** : بیبەن .

( خولامەکـە دەیبـات ،کاتێـك ڕۆیشـت پێکـەنی ،ئـیتر هەنـدێك لـە هاودەمـانی ئەوەیان باس کرد )

**حەجاج** : بیگێڕنەوە .. تۆ نەتووت هـەرگیز پێنەکـەنیوی ؟ چـی وای لێکـردی ئێستا پێبکەنی ؟؟

**سـەعيد** : پێدەكەنم لە زات كردنت بەرانبەر خواو ،ئارامگرتنی خوای گەورە لەسەرت.

**حەجاج** : ( بەقینەوە ) بیكوژن .. بیكوژن .

**سـەعيد** : ( ڕوو دەكاتە قیبلە )

" وجهت وجهی للذی فطر السموات والارض حنیفا وما انا من المشركین "

**حەجاج** : ڕووبكە قیبلەی گاورەكان ،ئەوانەی كە پەرتەوازە بوون و بەناڕەوا دوو بەرەكییان كرد ،چونكە لە كۆمەڵی ئەوانە .

**سـەعيد** : ( بەخەندەیەكەوە ) " ولله المشرق و المغرب فاینما تولوا فثم وجه الله "

**حەجاج** : ( قین و توڕەیی زیاتر دەكات ) بیدەن بە زەویدا لەسەر ڕووی ،ڕووی بكەنە خاك.

**سـەعيد** : " منها خلقناكم وفیها نعیدكم ومنها نخرجكم تارة اخری "

**حەجاج** : دوژمنی خوا سەر بڕە ،زمانی چەند پەلەیە بۆ قورئان.

**سـەعيد** :شایەتی دەدەم هیچ خوایەك نییە جگە لە خوای گەورە ،هەروەها شایەتی دەدەم كە موحەممەد بەندەو پێغەمبەری خوایە ،ئەو قسەم لێوەرگرە تاكو لە ڕۆژی قیامەتدا دەمبینیتەوە ئەی حەججاج ،خوایە لە پاش من دەسەڵاتی نەدەیتە سەر كەسی تردا بیكوژێت.

(پـــــەردە)

## ( دیـــــمـــــەنی کـــــۆتـایـــــی )

( حـەججاج خـەوتووە لەسـەر تەختەکـەی لـە خـەوێکی قوڵدایـە ،لـە پڕێکـدا ڕادەچڵەکیٚ )

**حـەجاج** : فریـام کـەون فریـام کـەون ! ئـەی هـاوار ،ڕزگـارم بکـەن لیـّی ،ئـەو دەیەوێت بم خنکێنیٚ...دەیەوێت بمکوژێت !

( خولاّمەکەی دێتەلای )

**خولاّم** : ئەوە کێیە گەورەم ؟ کەس لێرە نییە !

**حەجاج** : خۆیەتی ،ئەوە س..س.. سەعید

**خولاّم** : سەعید... کیٚ؟!

**حـەجاج** : بـەلاّم لیێـدا ! سـەعیدی کوڕی جوبـەیر ... بینـە قاقـای گرتـووم.. ئیستا دەمکوژێت .

**خولاّم** : سەعید بۆ دوو هەفتە دەچێت کوژراوە .

**حەجاج** : تۆ وڕێنە دەکەیت ،ئەو نەمردووە ،ئێستا بینیم وەکو وشتری هار ، دەیەوێت هەڵملوشیٚ.

**خولاّم** : ئەوانە گومان و خەوی تێکەڵ و پێکەڵن .. سەعید مرد سەعید خۆت کوشتت.

**حەجاج** : نانا من نەم کوشت ،من نەم کوشت ،ئەوان کوشتیان .

**خولاّم** : تۆ یان ئەوان ،گرنگ ئەوەیە کوژراو نێژرا.

**حەجاج** : ئەی گەمژە ،دەتەوێت قایلم بکەی بە مردنی پیاوێك چەند ساتێکە لەسەر سەرم ڕەواستابوو ،دەیکرد بە یەخەمدا ؟!

بەلاّ لە حەججاج کەوێت ! کەس باوەڕی پێناکات تەنانەت خولاّمەکەی خۆیشی ،دەرگاکەم لەسەر داخەو وازم لیَ بهێنە !

( خولاّمەکە دەردەچێت ئینجا ڕادەوەستێت و دەڵێت )

**خولاّم** : پاك و پاراوی بۆ تۆ خوای گەورە ،هەرکیَ بتەوێت سەر بەرزی دەکەیت و ،هەرکیَ بتەوێت سەر شۆڕی دەکەیت ،لە ڕاستیدا سەرشۆڕی حەججاج بەڵگەیەکە لەسەر بوونی تۆ ئەی لە هەموو کەس دادگەرتر !

( حەججاج لەسەر جێگاکەی ڕادەکشێت ... چەند ساتێکی پێدەچێت و ،ئەم دەنگە لە گوێیدا دەزرنگێتەوە ):

ــ بەڵکو تۆ هەڵبــژێرە ئەی حەججاج ! سوێند بە خوا بەهەر شێوازێك بمکوژیت ئاوها خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا دەتکوژێتەوە .

( حەججاج جارێکی تر ڕادەچڵەکێتەوە ).

**حەججاج** : ئای.. تکایە.. تکایە ..مەمکوژە .. مەمکوژە .. ئای ..ئای.

(خولاّمەکە دێتە ژوورەوە )

**خولاّم** : چیتە گەورەم ؟! ئارام بە.. مەترسە

**حەججاج** : چۆن نەترسم ؟! تارماییەکەی وازم لێناهێنیَ ، لە پێشمدایە لێم جیانابێتەوە ، ئایا نایبینی؟

**خولاّم** : ( بەدەنگێکی نزمەوە ) سەیرە !! حەججاج کە هەزارانی دەترسان ئەمڕۆ لە تارماییەك دەترسیَ ؟

**حەججاج** : ( گوێی لیَ دەبێت ) ئەوە تارمای نییە ئەی گەمژە ،ئەوە سەعیدە بەخۆی سوورە لەسەر کوشتنم .

**خولاٌم :** ( بەسوکایەتی یەوە ) باشە بۆچی ئەوەندە لە کوشتن دەترسی ؟ تۆ چەند ساڵە خەڵکی دەکوژیت ،دە بیچێژە ئەمڕۆ ئەوەی کە دەرخواردی خەڵکیت دەدا .

**حەججاج :** ( بە توڕەییەوە ) ئایا شادی دەر دەبڕی لە حاڵم ئەی نادان ؟ ئەگەر تەمەن دەرفەتم بدات دەبێت بتکەم بە پەندو سزات بدەم .

**خولاٌم :** ئایا لەسەر جێگای مردنیش هەر زۆرداری ؟! بۆ ساتێك خۆت بەکەم بزانە پێش مردنت لەبەر خوا ،بەلاٌم بەخوا دوورە .

ڕاستی فەرموو خوای گەورە ﴿وَلَوْ رُدُّوا لَعَادُوا لِمَا نُهُوا عَنْهُ وَإِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ﴾ **الأنعام:٢٨**

( حەججاج لەسەر تەختەکەی دەکەوێتە خوارەوە )

**حەججاج :** ئای... چیم دابوو لە سەعید ؟! چیم دابوو لە سەعید ؟!

( زیاتر زەنەقی دەچێت و ،هاوارێك دەکات و دەمرێت )

( لەو کاتە دەنگێك دەبیسترێت نازانرێت خاوەنەکەی کێ یە )

﴿ وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱللَّهَ غَٰفِلًا عَمَّا يَعْمَلُ ٱلظَّٰلِمُونَ ۚ إِنَّمَا يُؤَخِّرُهُمْ لِيَوْمٍ تَشْخَصُ فِيهِ ٱلْأَبْصَٰرُ ﴾ **إبراهيم: ٤٢**

"مهطيعين مقنعي روؤسهم لايرتد اليهم طرفهم وافئتهم هواء "

( پـــــــەردە )

ـــــ تەواو بوو ـــــ